نێوی کتێب : ئێستا لە نێوان دو ئاوێنەدا
شاعیر: محەممەد تەرەغە
ناشر: عابد
وێنەی رووبەرگ و تابلۆکانی ناوەوە: فەرزاد ئەدیبی
پیتچن، کوردیکا

دەگەڵ سۆمانەی کاکم (ڕەحمان تەرەغە)

پێشکەشە :

بەو کەسانەی ئەم شێعرانە ناخوێنەوە

ئێستا لە نێوان دو ئاوێنەدا

محەممەد تەرەغە

١

*شەقڵ*

لە وڵاتێکی سەیر ڕا دێمەوە
هیچ شتێکی لە وڵاتی ئێمەی نە دەکرد
مرۆێەکانی لە رواڵەتا پێدەکەنین
کەچی سۆزی پێکەنین لە چاوەکانیان نەدەباری
ئارام دوێ بوون
کەچی بە ددانی گڕیان
کە دەهاتنە گۆ
بیری مەندی ئینسانیان دەشڵەقاند
ساوی و گرژی رووکاریان
هەر رواڵەتی یەک نەبوو
بزەیان پشکووتنی خونچە دڕک بوو
توورە بوونیان وەها کردەوەیەک
کە مرۆێی ئەم سەدەیە نەیدیوە

* * *

له سەفەرێکی تاڵ دەگەڕێمەوە
بە کۆڵە بارێکی پڕ مەینەت و بە / بڕوا / گەیشتوو
بە لەشێکی بیزراو لە ژین
بە ورەیەکی تەیار
بە هەستێکی سوواو
بە دڵێکی واڵا / بەرەو / ئێوە

* * *

لە وڵاتێکی سەیر ڕا دێمەوە
هیچ شتێکی لە وڵاتی ئێمەی نە دەکرد
وەرزەکانی بە رواڵەت ئاسایی بوون
کەچی بەهار بە پیلانی سێزدەبەدەری
تەواوی گوڵ و گڵووکی
داربادامی هەرێمی ژینمی
دەگەڵ خۆی برد
مەلی نیگام
ئیتر بە سەر داری ئەو هەرێمەوە
تینی هەڵفڕینیان نەما
تەنانەت سێزدەبەدەر
دیارییەکانی بە هاریشی دەگەڵ خۆی برد
ئیتر بۆنی عەتر پژێنی گوڵە سێوەڕە
لە نیوەی ڕێدا ناکام ما
گڵووکی سەیدووکە بێ کامڵ بوون هەڵوەری
گوڵە گەنم بوو بە چاوانی وڵاتم و
کۆ ئەنگاوتی.

* * *

لە وڵاتێکی سەیر ڕا دێمەوە
لە وڵاتی وەرزە کۆچ کردووەکان
لە وڵاتی گەڵا با بردووەکان
گەر هەنگاوێ بچمە دواوە
ئەگەمەوە ناو ئەو دۆزەخەی
کە وەرزەکانم مانیان گرتبوو
منیش عەشقێکی نسیان کراو بووم
بە شوێن ساڵی نانا دەگەڕام
ساڵی نانم ڕەنگی دایکمی گرت
عەشقی نسیان کراوم
بۆنی فرمێسکی دایکمی لێوە دەهات
منیش هەر بە تەنیا وێڵی شاخ و
وێڵی دەشت و
وێڵی عەشقی نسیان کراوم بووم
گەر هەنگاوێ بچمە دواوە
ئەگەمەوە ناو ئەو چۆڵگە مەزنەی هەرێمی بابم
کە لەوێ هیواکانیان لە دار دا
هەر هیوایە و خۆی بوو بە دارێک و بەری گرت
هەر بەرەو لە ڕواڵەتا یەک و لە ناویا چەند
کە زمانی پەیوەند کراویانی تواندەوە
ئێستا /من/ لە ناو چۆڵگە مەزنەکەی
هەرێمی بابمدا
لە ناو دەشتە بۆ فرمێسکاوییەکەی دایکمدا
بوومە کەژاوەی دارستانێکی چڕ
بوومە کانی و لە ناخی کێوا
هەڵدەقوڵێم

بوومە بارانە و لە دەرکەی گەواڵە هەوران دەدەم
ئێستە من وام، لە ناخی خۆما
هەڵدەقوڵێم

*   *   *

عیشقی من کانییەکی قژ سەوزی
داوێنی چیا بوو
هەر بە منالّی زەوتیان کرد لێم
ئێستە چاوەکانم نیشانگەی
ئەو سەنگەرە بە هەیبەتەی داوێنی چیایە
کە کراسێکی سووری لە بەردایە و
رۆحێکی سەوز لە گیانی دا
رۆحم گەڵاڵەی شێعرێ بوو
لە ناو دەستی بابما دەبوو بە داس
لە هی دایکما بە تەشی و
لە هی خوشیکیشما بە قەڵەم
ئەمانە هەوێنی شێعرم بوون و
شێعرم پێ دەنووسین
بەڵام ئێستا عیشقی منالّیم
هەر کاری هەمویانم بۆ دەکا
رۆژێ شێعرە و لە ناو هەستی شاعیرانی مەزن دایە
رۆژێ ئاوازە و
لە ناو ئەوکی خۆشەویستانا
رۆژێ هەستی ناسکی
دایکانی ئەم وڵاتە بێرەنگەیە
رۆژێ کانی دڵی کێوە
رۆژێ سەنگەری دڵدارانە

## ٢
## ئاوێنە

چ پەیمانە دەگەڵ ئەوینی پیرۆزت
وێنەی قەقنەس
دەسووتێی و دەژێتەوە؟
لە بەستە بە سۆزەکانت
ئاوێنەم دروست کردووە
کە سیمای هەموو گەلانی تیا ئەبینم
نازانم، وەک بەردی ژێر ئاش
چاک سوواون
یا دڵت گەورەیە و بۆتە ئاوێنەی باڵا نوێنیان
* * *
کاتێ خەیاڵ ئەیلێتەوە
«منی لە ناو حەڵقە حەڵقەی زنجیری کۆنی یاساکان
شەتەتەک دراو»١
دوو چاوی من دەبنە پەنجەی هەواژەنی
شمشاڵی شوانێکی هاوڕێی دەرد و کەسەر
کاتێ دەچمە ناخی شێعرت

ئەگەر رۆژ بێ
خۆر لە سەر شانی شێعرەکانت بۆم ئەڕوێ!
ئەگەر شەو بێ
خەیاڵ لە پێدەشتێکی تاریک و چۆڵا
لە خەمەکانت بۆم ئەدوێ
بەڵێ هاوڕێ
دڵنیام کە ئەوینی راستەقینەی تۆ
قوفڵی دەرکی چەوساوەیی دەشکێنێ و
خەو لە چاوی خۆری نووستوو دەزڕێنێ
پەیامی خۆشەویستیش بە گوێی هەموانا
دەچرپێنێ

''□□١ـ ئەم دێرە شێعرە هی شاعیری جوانە مەرگ (رەحمان تەرەغە)یە.

٣

یەک

وەک مێژوو هەرەس ناهێنی و
زەوی ئاسا
ساتێ لە گەڕان ناوەستی!
تا مەزرۆیی هاتنیشت
وەکوو تاڵی هەتوانێکە
زامی دڵی هەموومانی پێ دەبەستی!
"

٤

بێدەنگی

چاوەکانم
نیشانگەی ماڵەکەتانە
نەکا ڕۆژێ
تۆفان هەستێ و
تۆ ڕێ ون کەی.
"

٥

که منالٚ بووم و دەگریام
دایکم دەرسی «سستی» دادام
کاتێکیش چوومە مەدرەسە
مامۆستاکەم
ئەو دەرسەی لە دایکم چاکتر
فێر کردم و ...
ئێستاش لە شەوگاری ڕەشی کچێنیم دا
دۆلٚپایەک لە سەر شانمە
کە دێم هاوار کەم
توند توند زارم دەگرێ و
پێم دەلٚێ:
سست!!

"

## ١
## شەقڵ

دۆینێ شەوێ
مۆدزادێک١
هەتاوی لە کۆڵ نا بوو
تا کوو بیکاتە گڵۆپی بارەگاکەی
بە خەڵکیشی دەگوت:
ئامانجم چاک وەدی هێنان
ئێوە کە یەک ڕەنگیتان دەوێ!!

"١ـ مۆدزاد: دێوەزمە، مێردەزمە، دزێو، ناحەز.

## ٢

## *ئاوێنە*

غەمی جارانم
لە ناو دڵدا کڵەکەی دەکرد و
پاشانیش دا دەمرکا
بەڵام غەمی ئێستام
لە ناو دڵدا جەللەی بەستووە و
هەر لەگەڕ دایە
دەزانم جەمسەرەکەی
وەک رازی نهێنی کۆچت
قەت وەدی نایە.

"

٣
یەک

ئەو گوڵە شێعرەم
بە نیەتی عیشقی دار بادامەوە
بۆ ناردووی
ئاخر ئەویش
ئەوندە ئاشقە
پێش ئەوەی
لەلایەن بەهارەوە
نامەی سەوزی پێ بگا
گوڵی بهێڵێنی دەدا

"

٤

بێدەنگی

شەو و
رۆژ
بە شوێن
یەک دا
دوو سەریان داوە بە ژیان
با شەو و رۆژ تێکەڵ کەین
ژیان یەکسەرە خۆشە.

"

٥

شێعر بڵێم وەک چ دەچێ ؟
وەک هەستی دایکم
ناسک ناسک
ناسکتر لە عیشقی تازە لاوێکی گراو
ناسکتر لە هەستی شاعیرێکی تازە لاو
شێعر بڵێم وەک چ دەچێ؟
وەک باڵی پەپوولەیەک
کە لە ناو گڕیش دا
هەر بە تاسەی هەڵفڕین لێکیان دەدا
شێعر بڵێم وەک چ دەچێ؟
وەک کۆتری هەڵوێستی شاعیرێک
کە سیاسەت باڵێکی بێ و
هونەریش باڵەکەیتری.

"□□ئەم شێعرە پێشکەشە بە شێعری «شێعر چیە»ی کاک سەعید ئەمانی.

## ١
## شەقڵ

چیرۆکی هاتن بۆ ئەو ژووره تەنگ و تاریکه،
کە هەر لە ژووره تەنگ و تاریکەکەی تۆ دەچێ
دەگێرمەوه:
لەم وڵات و زەویەدا
پادشایەکی چەوسێنەر دەژیا
دەبوایه هەر رۆژێ
لاوی گەڕەکێک
بووبانه فەرشی بەرپێی و
ئەویش دەیکردن به پلله
بۆ هاتنه خوار و چوونه سەرێی کۆشکەکەی
لە رۆژێکی وەک ئەو رۆدا
کوڕە هەژارێک
راپەڕی دا و...
کەچی زەفەری پێ نەبرد
کوڕە هەژاره دەرباز بوو
بەڵام پادشا لە جاڕی دا
«هەر کەس ئەو لاوه (دوو مۆر)مه١ بۆبگرێ

**زێڕ وەشانی باڵای دەکەم**
**براکەی خۆی**
**ئەرێ براکەی خۆی!!**
**لاوی دایە دەستی پادشا**
**لەو رۆژەوە منیش کەوتوومە**
**ژوورێکی تەنگ و تاریک**
**وەک ژوورەکەی تۆ.**

**''□□١ـ دوو مۆر: بیژوو ـ زۆڵ**

٢

*ئاوێنە*

وە بیرت دێ!؟
ئەو دەمەی
دەگەڵ دەفتەرەکەت دەکەوتییە راز و نیاز،
چۆن سیمای تۆ و ئەو
دەبوونە ئەستێرەیەک
رادەخوشیە نێو ئاسمانی
بێ ئەستێرەی هەژارانەوە
ئێستا دەفتەرەکەت هەتاوێکە
هەگبە هەگبە نوور دەبەخشێ و
ئارام، ئارام
پەرچەمی زێوینی تاێگە دادەهێنێ
ئەوجار گوڵێک
کە لە حەو رەنگ گەڕا بێ
بەو کەسانەی رەنگی تابلۆی
ژینیان نەدی،
دیاری دێنێ.

ئەمڕۆ ئەو تابلۆ حەو رەنگە
پەیکەرەیە
سیمای ئاسمان لە چاوانیا
بەدی دەکەم.

"

٣

یەک

رووبار دیلە و کانیشی لێ زەوت دەکەن
لە بەر ئەوەی بێ سنوورە
دێن بەهاریش سەر دەبڕن
چونکە وەرزی سەر هەڵدانە
ڕێی کەژ لە کەژەوان دەگرن
چونکە بەرەو بەرزی دەڕوا
دەیانهەوێ
لە تاوڵی بیری رەشیاندا
قەتیسمان کەن
بەڵام زل کوێرن ئەوانە
چونکە دەریای جیوەی بڕوامان نابینن.

"

٤

## بێدەنگی

نیگای گەزیزەییت
سێوە سوورەکەی دەستی دایکم بوو

نیگای گەلاویژت کە ئەنگووت
بە ئەوینی کچە کوردیکی هەژار چوو
بەڵام / من
لە تۆی ناسکی ئەو عیشقەدا
لە ئاستانەی زەمانەوە
یادی نیگای روبەهاری تۆ
دەخۆمەوە.

"

## ٥

ئێوارەیەو
هەوا وەکوو
رۆژەکانی عومرم شلوێ بووە
کێوەکانی بێستوون تا ئەو پەڕی عەوالان
لە کەژاوەی تەم و مژێکی
بێ بەزەییدا  راوەستاون

* * *

ئێوارەیەو
تنۆک تنۆک
قەترانی شەو
دادەبارێ بە سەر جەستەی بێ هێزم دا
ئێستاکە من
لە گۆمی قەترانی شەودا
نوقمی تاوانی عیشقی سەر هەڵ گرتووی خۆمم

* * *

ئێوارەیەو

**لە بیست و چوار سەعاتی**
**ئاسمانی رابردووما**
**زۆر ئەستێرەی چاو زەردم دی**
**بە شوێن ساڵی نانا خوشین**

**ئەمرۆکە من**
**وەرزێکی بێ بەش کراوم**
**بەرەو ساڵی یەک وەرز**
**رێ دەپێوم.**

"

## ١
## *شەقڵ*

ئاسمان شاعیرە و
کچە کۆچەرێکیش فاڵگر
ئەم شەو هەر دوو لە من میوانن
لەپی دەستێکم بۆ کچە کۆچەریەکە و
ئەوی‌تر یانم
بۆ ئاسمان گرتۆتەوە
کەچی لە سەر هەرکیان
ئاسمان هەڵنیشتووە
دەنگێکیش بە ئەسپایی پێم دهڵێ:
کۆترە باریکەی شێعرەکانت
تەرە بوون
وێڵی هێلانەی دەستی «لۆرکا»ن.

"

٢

*ئاوێنە*

**لاو لاو ئەوندە ئاشقە**
**چیلکەش لە ئامێز دەگرێ**
**بەڵام ئەمن سەد هێندەی ئەو ئاشقترم**
**چونکە هەرگیز دڵم نایە**
**کە بە خۆشەویستی تۆوە**
**کەسیتر لە ئامێز گرم.**

"

٣

یەک

تا کەنگێ شەم شەمە کوێرەی
بیری زڕتان
لە ناو دڵی شەوگارا
بەڕهڵا دەکەن؟!
خۆ بەیانی
چاویان لە بەر خۆر
هەڵ نایە.
"

## ٤

## بێدەنگی

لە وەتی ئەو چیایە هەرەسی هێناوە
ئەوکانییە دڵدارەی داوێنی
لە جێی خۆیا قەتیس ماوە و
هەستی رۆیشتنی ژەنگی هەڵێناوە

ئەمرۆ ئەوکانییە بێ نازە
بۆتە کچێکی کۆچەری و
دڵی بێژینگە ها لە دەستیا
سنوور ناناسێ و
شار بە شار و دێ بە دێ
هیچ کوێ نەماوە نەگەڕێ
کەچی بێژینگی دەستی
هەروا بۆنی تەنیایی،
بۆنی بێکەسی
لێ دێ...

"

ە

دڵ لێم یاخیە
وەک چۆن وشە لە شاعیر و
(کانی سەنگەران)١ لە تەرەغە و
لێڕەواری چڕ لە کێوی ئاربەبا و
دارستانە گوێز یش لە (دۆڵیحاجیکەند)٢

دڵ لێم یاخیە
وەک بەهار لە ساڵ و
وەک باران لە هەور و
وەک خۆم لە بێ تۆیی
دڵ لێم یاخیە...

"١ـ کانیەکە لە بەر قەدی چیای تەرەغە.
٢ـ دۆلێکی پڕ پیت و بەرەکەت لە ناوچەی بۆکان.

## ١
## شەقڵ

هێشتا دەنگ
چرۆی نەکرد بوو
بووی بە هەوێنی یەکەم شێعرم و
چوویە ژوانگەی یەکەم خەونمەوە

ئەوە جاری سێهەمە
لە سەر شانی خەونێکما
دەگێڕمەوە
بەهار بە فراوان قاواخی خۆی
لە چاوی هەوردا قەتیس مابوو
رۆحی یەکەم خەونم
شایەدی بو هەرێمی
چاوانی تۆ ئەدا

چی بڵێم
لە ناو کەوتن و

کەوتن و
کەوتن‌دا

بەرەو پیری
دەنگی بێدەنگی
لە گوڵەزەردەی
پشت شەوی چارەنووس
ژوانی تازەمان خۆش

"

## ٢

## ئاوێنە

لە وڵاتی چاوەکانتەوە هاتووم و
نیشتەجێی شاری تۆفانم
ڕۆژ نییە تۆفان نەم هەژێنێ
بەڵام ئەمن و یادی تۆ
وەک مێکووک واین
پاڵمان بە پاڵی یەکەوە داوە و
هەمیشە سەرسەوزین،
ڕیشەمان لە دڵی زەوی دایە و قەت قەت
لەبن نایەین

* * *

لە وڵاتی چاوەکانتەوە هاتووم و
نیشتە جێی وڵاتی شەو گرتووم.
شەو نییە لە ناو کەژاوەی
بیری کەسکمدا بەدیت نەکەم
جارێ تۆ دەسرۆکەیەکی سوورت بەدەستەوە
بە دمم شنەی گۆرانی کاک «جەماڵ»ـەDEL وە

ئەم شێعرانەت دەکوتەوە.
«تۆ ئەو ئەوینەی هەر لە دڵمای
تۆ ئەو ئەسرینەی هەر لە چاومای»
جارێکیش تۆ دڵت بە دەستەوە
دەتدایە دەست ئەو شێعرە مەعسوومەی
کە بێ تاوان خنکێندرا
جارێکیشیان لە ناو (ئاواتە خنکاوەکانمدا)
کە ئەم جارەیان تۆ
شەمێکت بە دەستەوە بوو
تێم راما بووی
* * *
لە ولاتی چاوەکانتەوە هاتووم و
نیشتەجێی دنیای پرسیارانم
لێم دەپرسن:
چۆنە نایەمە سەر گڵکۆت؟
بەڵام تۆ لە ناو دڵما نێژراوی و
منیش دایمە لە سەر دڵکۆتم.
لێم دەپرسن:
چۆنە هەموو بەیانیان کە شمشێری
یادی تۆ لە قەد دەبەستم و
دەچمە شەڕی فەرامۆشی
پاشانیش خۆم ئاگر دەدەم؟
ئاخر ئەمن
(یەفتاحی)١ دەورانم و
لە کاتی گەڕانەوەم دا
هەر خۆم تووشی خۆم دێم.

* * *

له وڵاتی چاوەکانتەوە هاتووم و

میوانی خۆت و شێعرەکانتم

شێعرەکانت عەتری کاتی ژوانمن

..... خۆشت .....

(ئیلهامی) ئەو شێعرەمی هێشتا نەمنووسیوی

(ئارامی) ئەو دڵەمی کە بە عیشقی تۆوەدەژی

(ئاکامی) ئەو ڕێگەمی کە تۆ دەتبڕی.

"□□(١) یەفتاح یەکێ لە داوەرانی بنی ئیسرائیل بوو، لە شەڕێکدا نەزریکرد کە ئەگەر پیرۆز بێ لە کاتی گەڕانەوەی دا هەر کەسێ هەوهەڵکەس تووشی هات، بیسوتێنێ، کاتی گەڕانەوەی یەکەم کەس کەتووشی هات، کچەکەی خۆی بوو. قەولی خۆی بردە سەر وسووتاندی.

٣

یەک

منیش وەک تۆ

لە خەوتن و خەونی ڕەنگاوڕەنگ
وەڕەز بووم
لە شوانە خڵەتێنەی وچانی ئەو خەڵکە بێزارم
لە دڕووی مەم و زینی
گۆڕی بیری ئەم گەلە
دڵمەندم.
تەمام وایە
وەکوو شاعیرە ناسک خەیاڵەکەی ئاسمانی خۆمان
دەس بدەمە
شەیپووری ڕزگاری و
هەر لێرە قیامەتێک
بەدی بێنم.

"

## ٤
## بێدەنگی

بڕوام پێ بکەن
لە چوارشەمە بازاڕی
ئەم بازاڕە ناوەختەدا
هێشتا نەهاتوومە دەر
ساڵی شلێرمم بە هەوری خۆمپێگەیاندو
سەمای خوێناوی شێعریشم
بە دەسکەنەی قژی باران
بڕوام پێبکەن
لە یەک شەمەبازاڕی
ئەم بازاڕە درەنگ وەختەدا
هێشتا نەهاتوومە ژوور
ساڵیزاییینیم لە چاوی هەورداپشکووتو
بۆ تنووکەیەک باران هاتە ویشک بوون

چاو لە چاوی شێعرم کەن و
جەهەننەم لە جەرگەی بەهەشتمدا ببینن
بڕوام پێ بکەن
هەڵەبجە دەستە خوشکی رووسووری
دۆزەخیمە.

٥

له هیچەوانی دەستم و
له تاوانی تامانی تەنیایمدا
من رەشەمه شەوێک
به سەر بستۆکەی شێعرمدا رشامەوە
له وشەلیوەی ئەم شێعرانەم تۆ سەرنج بدە
١
٢
٣
کێوێک له بەر دەما
کێوێک له سەر سەرما
کێوێک له ناو جەستەی چوارمێخه کراوما
هاته فەوەران کرن

کامه تاوانم خۆشتر بووێ؟
تراویلکه ستانی ئەم دەواره
یا توانەوە له سەر شانی هەورەکان؟

کامە زستانم خۆشتر بووێ؟
زستانی کێژانی هەڵەبجە
یا ئازارە زستانی تراویلکە ـ مان ـ
لە چاوانمدا

چاوانم چکۆڵە دەکەمەوە و
سەر هەڵنابڕم
لەو بەهارەی لە چوارچێوەی
سەرسەرم گیراوە

بەهار وەرزی رواڵەتە کۆچ کردووەکانە

"

(١)

لە ناو قەدەمەی هەستم و
لە دونیای چاوانی تۆدا
کڕ نۆشم برد بۆ کۆترە باریکەیەکی بێهەیاڵ
لە ناو کەروێشکەی پێکەنینی تۆ و
لە گەرما و گەرمی چرۆی پێ گەیشتندا
خۆم دایە دەست شەپۆلەکانی نەفەسی هەرمانی تۆ
لە چاو ترووکانێکا
چاوە بەهاریەکانی تۆ
چیها جار دەمکەنە چاوی چاوە ڕوان

لە ئاخاوتنە ساتیەکانا
سەدان جار برووسکە دەدەم و
دەبمە هاوڕێی بارانە
من شەپۆلە نەسرەوتووکانی هەناسەی دووریم
تادێ سەرکەشتر دەبم

من فرمێسکە بارانی شەوگاری تەنیاییم
لە ناو رۆحی چاوتا پۆنگ ئە خۆمەوە

بەهاری ئەوین و خۆشەویستیە ئەمساڵ
لە وەتی ئەوین بۆتە مەرام و چاوگەی بژیو
منیش بوومە پەیکەرەی ماسی‌یەک و
لە دڵی ئەوینەوە سەرم هەڵدا

ئێستا ئەوین کیژۆڵەیەکی بەرگ سووری‌نێودەمارمە

ئەوین کیژۆڵەیەک بوو
لە داوێنی تۆوە هاتەدی

وەرزی فەرعانە و دڵداری‌یە ئەمساڵ
لەوەتی فەرعانە کەوتۆتە چاوانی تۆوە
هێندەی ناسکی لێوەکانت، بزەم‌لە سەریان چنیوە

کاتی پشکۆ و ئاوێتە بوونە ئەم رۆژە رەوەکانە
لەوەتی پشکۆ کەوتۆتە ئەم هەوارە
چی‌دار و بەردی ئێرەیە
رەنگی پشکۆی لێ نیشتووە

من گڕکانی هەڵچووی نێو باوەشتم
لە هێڵی چاوانتەوە دێمە ژووریٚ
هێندەی خێرایی چاوانی برووسکە
هێندەی جیایی دوو هێڵی تەریب

من گڕکانی هەڵچووی نێو باوەشم
لە هێڵی چاوانتەوە دێمە ژووری...
"

(٢)

چەند خۆش بوو بەر دەرگاکەتان
ئەو شەوانەی
تریفەی مانگ
بە پێ دزە دەهاتە ژوور
کوڵمی جوانی ماچ دەکردی
ئەم تابلۆیە چ سێحراوی
منی خستە ناو کەژاوەی بیرێکی قووڵ
ئەو کاتانەی تۆ دەر دەکەوتی و
مانگیش خێرا ئاوا دەبوو.

(٣)

هەمو رۆژێ
بە رەو پیرت
ئەی کازیوەی بەختەوەری
چاوەڕوان دێم
بەڵام کاتێ
رووی بەزەییت وەردەگێڕی
رێی ئاوێتە بوون ون دەکەم.

"

(٤)

بزەی رۆحم
نیگای گەزیزەیی کەیلی تەمەنناى چاوم
گوڵی پشکووتووی (دەشتی شارەزووری) سینەم

هەر هیچیان
نە بوونە لەمپەری
ئەنگووتنی نیگای گەلاوێژت

ئێستا من
لە ناو هەستی شەوانەم دا
لە ناو ئامانج شاری کۆچەریانەم دا
(خاک و خۆلی) سەرگەردانم.

"

(٥)

بۆ ئیلهامی برازام»

چاوەکانت!
ئاو روون کەرەوەی دڵی شڵەژاوی منن
بزەکانت!
سروودی عەشقی لە دایک بوونن
دڵیشت ئەستێری رووباری ژینمە

ئیلهام! ئەی بەچکە سێرۆکەی،
گەرمێن نەدیتوو!
دڵم رواڵەتی تۆی گرتووە
ئێستە کە هێندەی تاڵی چارەنووسم لێت دوورم
لە گشت ساتەکان
بەرینتر
ئاوێتەت بووم
"

□□□روبارانە (١)

من ساڵێکیان
لە بەهارێکی بێ نەورۆزانەدا
گوڵە شلێرەم دی
ببوو بە چاوی
روبارێکی
ئاوارە و
سەربزێو.

"□روبارانە (٢)

من رووباری دەناسم
ساڵەهایە
غەمی خاک دەنووسێتەوە
وە بیرم دێ
بابم لە سەر غەمی رووبار دەنووست
چاوی دەبڕیە ئەستێرەیەک و
دەیگوت :
منیش وەکوو ئەستێرە
مێخەیان کێشاوم
کەچی شەو و رۆژ ئەدرەوشێمەوە

"□□□روبارانە (٣)

من جارێکیان لە دەمێکی سڵ و تووشدا
رووبارێکم دی
لە رەوتی خۆی دەترازاو
لە ئەستێرەی ون بووی خۆی
دەگەڕا.

"

## □تو ٌستان

(١)
تۆ ـ من
وەبالّمان
کەوێتە ئەستۆی
یاسای وشەکان

(٢)
تۆ...
ئاوێنەی دەستی خۆتی
بۆیە ئاوێنەت تێدەگرم

(٣)
تۆ...
ودمی بێدەنگی
بەدەردی زەویم نەبەی
بخولێمەوە لە دەورت
بێوچان

(٤)
تۆ و تاێگە
دەستە خوشکن
دایمە پێدەکەنن
تاێگە بۆ سروشت و
تویش بە خۆلیایی من

"

## ناوەرۆک

*The Present between two mirrors*

*The Poems*

:**By**
**Mohammad Taragha**